لەسەر ئەرکی هەڤاڵ تێکۆشەر محمد حاجی محمود چاپکراوە

# جەنگی ناوخۆیی



هیچ شۆڕشێکی گەورەی مێژووی نەیتوانیوە
بەبێ جەنگی ناوخۆیی بە ئەنجام بگات.

**برهان قانع**

لە فارسی یەوە کردویەتی بە کوردی
نیو زەنگ ـ ١٩٨١

**ئاگر برهان قانع**
سەرپەرشتی چاپی کردووە

★ تیۆری جەنگی ناوخۆیی.

★ جەنگی ناوخۆیی لەبەرباری سەرنجی چینەکاندا.

★ جەنگی ناوخۆیی لەبەرباری سەرنجی سۆشیالیزمی زانستی مارکس دا.

★ جەنگی عادیلانە و جەنگی ناعادیلانە.

**برهان قانع**

لە فارسی یەوە کردویەتی بە کوردی

نیۆزەنگ - ١٩٨١

ئەو بەرهەمانەی لە پاش خوالێخۆشبو برهان قانع بەجێماوە .

وەکو:

١ـ شۆڕشی ئەلبانیا.

٢ـ ڕاپەرینی گەلی ڤێتنام.

٣ـ یاداشتەکانی گیڤارا .

٤ـ گێژاوی پۆڵەندە.

٥ـ کورد شوناسی.

٦ـ ڕاپەرین لە ئەمەریکای لاتیندا ـ سلفادۆر کوبا ـ

٧ـ ٨١ هەشتاویەک گەورە پیاوی جیهانی.

٨ـ یاداشتەکانی کرۆپسکایا.

٩ـ نەتەوایەتی لە ڕوانگەی فەلسەفەی زانستییەوە .

١٠ـ لە بارەی مانگرتنەوە.

١١ـ شەری پارتیزانی پێشمەرگەیی.

١٢ـ مەسەلەکانی شۆڕشی چین

١٣ـ ئوصولی کۆمۆنیزم ـ سەرەتای کۆمۆنیزم .

١٤ـ کۆمونی پاریس.

١٥ـ مێژووی هاوچەرخ.

١٦ـ کۆمەڵێک کتێب لە سەر شریت تۆمار کراون.

هیچ فرماسیونێکی کومەلآیەتی لەبنەرەتەوە ناگۆڕیت ئەگەر لە ڕێگای ڕاپەرینێکی جەماورەی یەوە نەبێت . . هیچ ڕاپەرینێکیش بەبێ جەنگی ناوخۆیی ناگاتە ئەنجام . . جەنگی ناوخـۆیی ئەو ڕاپـەرینـە چەکـداری یەیە کەلە نێوان دەستەو کۆمەلە جۆربە جۆرەکان یان جین و توێژەکانی گەلدا بەرپا ئەبێت .

لەبـەرباری سەرنجی ماتەریالیزمی دیالەکتیکدا هەموو جەنگێکی ناو خۆیی شا مەسـەلـەی کومـەلآیەتی گەلەو بەستراوە بە کۆمەلگای چینایەتیەوە، لەبەر ئەوە توندو تیژترین شێوازی ڕاپەڕینی چینایەتیا نەیە .

مەرجە کۆمەلایەتی و ئابوری یەکان ڕۆلێکی گەورە لەبەرپابون و سەرکەوتن و کپ بونەوەی هەر جەنگێکی ناوخۆییدا ئەگێڕن . . هەموو جەنگێکی ناوخۆیی پێناسی پێشکـەوتـوانەی نیە . . کاتێك شۆڕشگێڕانەو پێشکەوتوانە ئەبێت کەلەلایەن چینێکی پێشکەوتوەوە بەمەبەستی گۆڕینی سیستەمی ئابوری ـ کۆمەلآیەتی کۆن بەرپا بێت . . خۆ ئەگـەر مەبـەستیشی لەنـاو بردنی دەسەلآتێکی پێشکەوتوانە یان دانە دواوەی چینێکی پێشکەوتوانە بێت ئەوا ڕوخساری کۆنەپەرستانە بەخۆیەوە ئەگرێ .

ڕاپەڕین، یان شۆڕش لەسەرەمەرگیسیستەمی کۆمەلآیەتی کۆندا سەر ئەکەوێت . . بەبێ هەل و مەرجی لەبار هیچ شێوەیەك لە شێوەکانی جەنگی ناوخۆیی ناتوانێ خۆی ڕابگرێ و بە ئەنجامی سەرکەوتوانە بگات .

جیاوازییەکی گەورەو بەدیار لە نێوان جەنگی ناوخـۆیی و ڕاپـەرینی چەکدارانەدا هەیە، ڕاپـەرینی چەکدارانە ئەبێتە قۆناغی سەرەتایی جەنگی ناوخۆیی، هەربەویش کۆتـایی پێ دێت. وەهەریەك لەم دوانە ئۆرگانی تایبەتی خۆیان هەیە. کە هەردوکیان هەریەکـە لەلایەن خۆیەوە ئەهمیەتێکی تایبەتیان لە مێژوی ئادەمیزادا هەیەو ڕۆلێکی گەورە لە بواری پێشکـەوتنی کۆمـەلـدا ئەگـێڕن . . هەروەکـو جەنگە ناوخۆییەکانی فەرەنسە، روسیە، ئەسپانیا کەدەستێوەردانی دەرەوەیان لەولآتدا نەهێشت.

هەل و مەرج گەورەتـــرین عونسـوری بنچینـەیی هەر ڕاپـەرین و جەنگێکی ناوخۆییە چونکە دەستەبەری سەرکەوتنیان ئەکات .

**ناصەوێت لەمە زیاتر درێژە بە پێشەکی ئەم باسەبدەم، وە بۆیە ئەم باسەم کرد بە کوردی شوێنی لە کتێبخانەی کوردی دابێ ناز بوو..**

**● برهان قانع ●**

# بەشی یەکەم

## تیۆری جەنگی ناوخۆیی

مەفهومی جەنگی ناوخۆیی،
جۆنیەتی ڕوخساری جەنگی ناوخۆیی،
شێوازەکانی جەنگی ناوخۆیی،
هەل و مەرجی ناوچەی جەنگی ناوخۆیی،
جیاوازی نێوان، ڕاپەڕینی چەکدارانەو جەنگی ناوخۆیی،
جەنگی ناوخۆیی لە هەل و مەرجی ئێستادا،
عونسورە بنچینەیی یەکانی هەل و مەرجی ئێستا
بۆ جەنگی ناوخۆیی،
دوا ئەنجامی جەنگی ناوخۆیی،
گەشە کردنی سەرمایە داری بەجەنگی ناوخۆیی ی
کۆتایی پێ دێت.

جەنگی ناوخۆیی بەو ڕاپەرینە چەکداری یە ئەڵێن کە لە نێوان کۆمەڵە جۆربە جۆرەکانی گەلێکدا یان لە نێوان چینە جۆر بە جورەکانی ولاتێکدا ڕوئەدات. . لە هەموو سەردەمەکانی مێژوودا کۆمەڵە چینایەتیەکان هەر لە سەردەمی کۆیلە داری یەوە بگرە تاك و سەردەمی فیودالی ـ لەسەردەمی فەرمانڕەوایی بۆرجوازی یەوە تاکو قوناغیکی دیاریکراوی فەرما نرەوایی برۆلیتاریا جەنگی ناوخۆیی هەبووە، بە هۆی تەنگ و چەڵەمەی ئابوری (بەتایبەتی لە ئەنجامی حوکم کردن ملکداریەتی تایبەتی دابەسەر هۆیەکانی بەرهەم هێنان دا) ومەسەلەی دابەشکردنی کۆمەلگا بە کۆمەلگایەکی چینایەتی جەنگی ناو خۆیی درێژەی بەبونی خۆی داوەو بەردەوام لە قۆناغێکی دیاریکراوی گەشەکردنی کۆمەلگادا سەری هەڵداوەتەوە.

لەبەرباری سەرنجی ماتریالیزمی دیالەکتیکدا جەنگی ناوخۆیی مەسەلەیەکە بەستراوە بە کۆمەلگای چینایەتی یەوە و لەگەڵ پەیدابونی چینە گەشەکردوەکان.

هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵ ئەو گەشەکردنەدا ڕاپەرینی چینایەتی یانەش گەشەی کردوەو فراوانتر بووە.

**لینین لەبارەی جەنگی ناوخۆییەوە نوسیویەتی:**

***«جەنگی ناوخۆیی توندو تیژترین شێوازی ڕاپەرینی چینایەتی یانەیە، کەشان بەشانی لێکدان و کلێشەی ئابوری و سیاسی ئەوەندە دوپات ئەبێتەوە، ئەکەوێت بەسەریەکدا، فراوان ئەبێت و توندو تیژی پەیدا ئەکات تاکو ئەو لێکدانانە بەشێوەی ڕاپەرینی چەکدارانەی چینێك لە دژی چینێکی تری لێ دێت.***

شەڕی ناوخۆیی لە تازەترین مەرجی مێژوویی دا لەلایەن چینە جۆربەجۆرەکانی وولاتێکەوە دەست پێ ئەکات وەبەپێ ی مەرجی ئابوری و کۆمەلایەتیەکان هەندێك جار سەرکەوتوانەو هەندێك جار بەنوشوستی چینی ڕاپەڕیو کۆتایی دێت، بەجورە جەنگی ناوخۆیی وەکو مەسەلە کۆمەلایەتیەکانی تر چەندان روخساری جیاجیاو مەبەستی لەیەك نەچوی هەیە. کاتێك کە بەمەبەستی گەشەکردنی باری کۆمەلایەتی بەرپا بێت ئەو کاتە پێشکەوتوانەیە، وەهەر کات تەگەرە بخاتە ڕێگای پێشکەوتنی کۆمەلەوە ئەو کاتە کۆنە پەرستانەیە.

## ٢- چۆنێتی جەنگە ناوخۆییەکان.

ناتوانین چۆنێتی جەنگە ناوخۆی یەکان لە ڕووی ماهیەتی چینایەتی شەڕکەرەکانەوە دیاری بکەین، چونکە ئەو جەنگەی کە لەلایەن چەوسێنراوانی وولاتێکەوە دژی چەوسێنەرەوانی ئەو وولاتە بەرپا ئەبێت مەسەلەیەکی پێشکەوتنخوازانەیە، وە ئەو جەنگەش کە لەلایەن چەوسێنەرەکانەوە هەڵ ئەگیرسێت **(ڕەنگە بێ)** هەندێك مەبەستی شۆڕشگێڕانەی تیابێت وەکو:

**یەکەم**: جەنگێکە فیودالەکان **(یان بۆرجوازیەکان)** لە قۆناغیکی گەشە کردووی خویانا لەدژی خاوەن کۆیلەکان یان فیودالەکانی وولات بەرپایان کردوە، **وەمەبەست** لەم شەڕەدا بەدەست گرتنی دەسەلاتی سیاسی و لەناو بردنی بنکە ئابوری یەکانی چینی فەرمانڕەوای کۆنە ئەوە بە جەنگێکی شۆڕشگێڕانەو پێشکەوتنخوازانە دائەنرێ..

**دووەم**: جەنگێك کە لە لایەن چینە زەحمەتکێش و چوسێنراوەکانی وولاتێکەوە دژی ستەمکاران و چەوسینەرەوان بەرپا ئەبێت ئەمەش دیسان شۆڕشگێڕانە و پێشکەوتنخوازانەیە **جونکە مەبەست بەدەست هێنانی فەرمانڕەوایی سیاسی وەیان تێکشکاندنی دەسەلاتی ئابوری چینە چەوسێنەوەکانە.**

پێویستە بەر لە هەموو شتێك چۆنێتی جەنگە ناوخۆییکان لەبارەی مەبەست و ئامانجی شەڕکەرەکانەوە دیاری بکەین.

جەنگی ناوخۆیی کاتێك شۆڕشگێڕانەو پێشکەوتنخوازانەیە کە لە لایەن چینێکی پێشکەوتوەوە بەمەبەستی گۆڕینی سیستەمی ئابوری و حوکم گرتنە دەست بەرپا بێت **ئەگەرچی ئەو چینە پێشکەو تووەش چەوسێنەرەوان بن)**، یان لە پێناوی بەدەست هێنانی باریکی ئابوری گەشەکردوو ئازادی سیاسی **(بەهۆی چینە زۆرلێکراوەکانەوە)** دەست پێ بکات.

بەپێچەوانەشەوە جەنگی ناوخۆیی ئەگەر بەمەبەستی لە ناوبردنی هەوڵ و تەقەللای چینە پێشکەوتوەکان و بەمەبەستی مانەوەی دەسەلاتی کات و داکۆکی لەسەر چینێك بکات لە ڕووی پێگەیشتنەوە لەبارو چۆنیتەکی کۆنە پەرستانەدا بێت ئەوا ئەو جەنگە تەنیاو تەنیا یەك مەسەلەی کۆنە پەرستانەیە، ئەگەرچی هەڵگیرسێنەرەکانیشی لە چینەکانی خوارەوەش بن.

بەکورتی هەر جۆرە جەنگێکی ناوخۆیی کە لە لایەن چینێکی دژ بە شۆڕش و بەمەبەستی لەناوبردنی چینی پێشکەوتویان لە پێناوی گەڕانەوەی دەسەلاتی لەدەس چوو **(لەدوای سەرکەوتنی چینی پێشکەوتوو)** بەرپا بێت ئەوا جەنگێکی تەواو کۆنە پەرستانەیە.

***«شۆڕش لەکاتی گەشەکردنیا هەمیشە توشی گیروگرفت و ئالۆزی ئەبێت، چونکە بە پێی وتەی مارکس شۆڕشی ڕاستەقینە واتا شۆڕش (خەڵکی) قۆناغێکی تەواو ئالۆزە لەناو ڕاپەرینی سەرمەرگی سیستەمی کۆمەلایەتی تازە کە سەرچاوەی زیانی دەیان ملیۆن کەسە. شۆڕش توندو تیژترین و بێ بەزەییانە ترین قۆناغی ڕاپەرینی چینایەتی و جەنگی ناوخۆیی یە، هیچ شۆڕشێکی گەورەی مێژوویی نەیتوانیوە بەبێ جەنگی ناوخۆیی بە ئەنجام بگات».***

## ٣ ـ شێوازەکانی جەنگی ناوخۆیی:

جەنگی ناوخۆیی چەندان شێوازی جۆربە جۆری هەیە، ئەگەرچی هیچ یەکێك لەو جۆرانە ناتوانین لە دەرەوەی ئەو تیۆری یانەی کە لە سەرەوە باسمان کردن بگرینە بەرچاو، بۆ ئەوەی باسکردنیان لە بارەی هەسبت کردن بەمێژووی جەنگی ناوخۆیی یەوە شتێکی باشە ئێستا لای خوارەوە،

**گرنگترین مەسەلەیان باس ئەکەین:**

١ـ **شەڕی ناوخۆیی**: نەك تەنیا لە نێوان چینە جۆر بەجۆرەکانی گەلێکدا ڕویداوە بەڵکو لە نێوان دەستەو کۆمەڵەسەر بە چینێکیشدا ڕویداوە، وە لەوانەشە لە کۆمەڵگای چینا یەتیشدا دیسان هەبێت وەکو ئەو جەنگەی کە لەساڵەکانی ١٨٥٥ ـ ١٨٨٥ دا لە نێوان ئەرستۆکراتە فیودالەکانی ئینگلستان دا **(گوڵی سور و گوڵی سپی)** ڕویدا.

بنچینەو هۆی ئەم جۆرە جەنگانە بەر لە هەموو شتێك پێویستە لە چۆنێتی هەل و مەرجی ئابوری و کاتی دەستەو کۆمەڵی ئەو چینانەدا بدۆزرێتەوە کە لەم شەڕەوە گلاوون، وە ئینجا لە جیاوازی ئاستی ئابوری و سیاسی یان بەوردی بکۆڵرێتەوە.

٢ـ **جەنگی ناوخۆیی**: لەوانەیە لە قۆناغێکی دیاریکراوی مێژوودا ڕووکەشێکی ئاینی لەمەیدانی ڕاپەرینی چینایەتی دا بەخۆوە بگرێت ئەم جۆرە جەنگە لەکاتێکا ڕوئەدات **(کە کۆمەڵگا چینایەتی بێت)** وەیان لەوانەشە لەدوای ئەو قۆناغە ڕوبدات کە ئایدیۆلۆجی چینی گەشە کردوو **(یان چینی کۆنە پەرست)** کە لە ڕووی فرماسیۆنە کۆمەلایەتی یەکانەوە بەدەست کەسانی ئاینییەوەو بێت و خواستە ئابووری و کۆمەلایەتی یەکانی چینەکە بەشێوەی ئایینی دەرکەوون.

٣ـ **جەنگی ناوخۆیی**: لەوانەیە بە پشتیوانی ڕاستەوخۆی چەندان دەستەو تاقی سپاوە

لەوولاتێکدا ڕوبدات، وە ئەم هێزانە لە ئەندامانی چینە جۆربە جۆرەکان پێك هاتووەو کۆبونەتەوە.

بەلام ناتوانین باوەڕ بەوە بکەین کە ئەم جۆرە جەنگە بەپێی ئەوتیۆری یە هەل ئەگیرسێ کە باس کرا، جونکە ئەم جۆرە شەڕە ناوخۆییانە وەنەبیت هەمویان لەناو هێزەکانی خۆیانا سەرکردایەتیەکی ڕێك و پێکیان هەبێت بەلکو زۆربەی ئەندامەکانیان هەریەکەیان سەربە چینێکی دیاری کراوە، وە دیسان هێزەکانی هەریەك لە دەستە ڕاپەریوەکان **(جگە لەوەی کە سەرکردایەتیەکی تایبەتیشیان هەبێت)** پشت بەو پایانە ئەبەستن کە لە ڕووی کۆمەلایەتی و ئابووری یەوە لەگەل پایەکانی لایەنەکانی ترا گەلێك جیاوازن.

## ٣- مەرجە ناوچەیی یەکانی جەنگی ناوخۆیی:

لەکاتی هەلگیرسانی جەنگی ناوخۆیی دا هەریەك لە هێزە شەڕکەرەکان ناوچەیەکی تایبەت لە وولاتدا **(کەلە ڕووی کۆمەلایەتی و ئابووری یەوە بۆ چالاکی خۆیان لەباربێت)** هەل ئەبژێرن و ئەیکەنە مەلبەندی خۆیان، بۆ نموونە:

لە جەنگی ناوخۆیی سەدەی ١٧ هەڤدەمدا لە ئینگلستان **(سەلتەنەت)** پشتی بەدانیشتوانی ناوچە شێوە فیودالەکانی ژوورو ڕۆژئاوا بەست، لەکاتێکداکە **(پەرلەمان)** ناوچەکانی خواروو ڕۆژهەلاتی بۆ خۆی دەست نیشان کرد کە لە ڕووی بازرگانی و سنعەتەوە زۆرتر لە ناوچەکانی تری ئینگلستان پێشکەوتو تربوو. وە دیسان سودی لە یارمەتی و هاریکاری کردنی ناوچە سنعەتییەکانی ژووروو ڕۆژئاوا وەرگرت:

هەروەها:

لە سالەکانی ١٩١٨-١٩٢١ دەستەو کۆمەلە دژ بە شۆڕشەکان لە روسیە تەنیا لەو ناوچانە ئەیانتوانی بمێنێتەوەو دەولەتی خۆیان دابمەزرێنن کە سەرمایەداری کەمتر گەشەی تیاکردبوو، وەپرولیتاریا لەچاو کۆلاکەکان[1] زۆر کەمتربوون **(هەروەکو روسیای سپی)**..

بەکورتی، بەبێ بوونی هەل و مەرجی ناوچەیی لەبار هیچ شێوەیەك لە شێوەکانی جەنگی ناوخۆیی ناتوانێت لە ماوەیەکی کەم یا زۆردا خۆی ڕابگرێ و بمێنێتەوە، جونکە ئەگەر باری ئابووری ئەو ناوچەی شۆڕشگێڕەکان تیادا ڕائەپەڕن لە بار نەبێت ئەوا، سەربازگیری و کاروباری چەك هەلگرتن و بلاوبوونەوەی بیروباوەری شۆڕشگێڕەکان و

---

١- کۆلاك - خاوەن ملکەبچوکەکان.

**بنچینەیی دەست کردن بەشۆڕش و سەرکەوتنی**تیا بەڕێوە ناڕوات . لە هەندێك لەو جەنگە ناوخۆیی یانەدا کە تا ئێستا ڕویداوە ئەوە ئەبینین کە دەست کردن بە شۆڕش و چۆنیتی گەشـە کردنی مێژوویی لەبـەشێکی ئەو وولاتەدا ڕۆڵێکی گەورەی لە نێوان دەستە دژ بەیەکەکاندا گێڕاوە، وەکو:

لە جەنگی ناوخۆیی ١٨٦١ـ ١٨٦٥ لە ئەمەریکای ژووروو، کە لە نێوان دەوڵەتە یەك گرتـــووەکـــانی ژوورو خوارووی ئەو وولاتـــەدا ڕویدا، چ ژوورووییەکـــان و چ خوارووییەکان هەردولایان دەزگای دەوڵەت تایبەتی یان بۆ درێژەدان بەشەڕەکەیان هەبوو کە مەکـانیسمی دەوڵـەتـە یەکگرتووەکانی ژووروو مەڵبەندی فەرمانڕەوایی بۆرجوازیە سنعەتکارەکان بوو، وەمەکانیسمی خواروش خاوەن مڵکە فیوداڵەکان حوکمیان تیائەکرد .

وەهەروەها :

لە شۆڕشی **(ئۆکتوبەری روسیادا)** ئەو ناوچەی کە لە ڕووی سنعەتەوە لە گەلێك لە ناوچەکانی تری وولاتی روسیا پێشکەوتوتر بوو لە هەموو ماوەی شەڕدا بەدەست دەوڵەتی پرۆلیتـــاری سۆڤیەتـەوە بوو، بەڵام ناوچـەکـانی تر هەر ماوەیەك بەدەست یەکێك لە هێزەکانەوە بوو.

## ٤ـ جیاوازی نێوان ڕاپەڕینی چەکدارانەو جەنگی ناوخۆیی..

ڕەنگە پێ پرسیاری ئەوە بکەن کە جەنگی ناوخۆیی و ڕاپەڕینی چەکدارانە **(لە کاتێکدا کە یەك ئامـانجیـان هەیـە)** جیاوازی یان چییە؟ گرنگترین ڕوخساری جیاوازی جەنگی ناوخۆیی و ڕاپەڕینی چەکدارانە لەم سێ خاڵەی خوارەوەدا دەردەکەوێ :

١) ڕاپەڕینی چەکدارانە وەکو قۆناغی سەرەتایی جەنگی ناوخۆیی وایە چونکە لەڕووی ئەندازەی شوێن و جێگاوە، لەڕووی فراوانی چالاکی یەوە، لەڕووی درێژەی ماوەی شەڕەکەوە لە جەنگی ناوخۆیی کەمترە .

٢) ڕاپـەڕینی چەکـدارانە لەکاتی بونی هەل و مەرجی لە باری ئابوری و کۆمەلایەتی دابەشەڕی ناوخۆیی کۆتایی پێ دێت، لەکاتیکدا جەنگی ناوخۆیی بەرزترین قۆناغی شۆڕشەو ڕاستەوخۆ بە سەرکەوتن یان شکستی هەردولا کۆتایی پێ دێت، دوا ئەنجامی ڕاپەڕینەکە بەدەرئەکەوێ .

٣) لەجەنگی ناوخۆیی دا هەردولا چەند دەزگایەکی ناوەندی یان هەیە واتە ڕاپەرینی چینایەتی ئەگاتە ئەو ڕادەیەی کە هێزە شۆڕشگێڕەکان یان دژ بە شۆڕشەکان سود لە دەزگاو ڕێکخراوە سەرکردەیە تایبەتەکان وەربگرن و ئەم دەزگاو ڕێکخراوانەش بە ئاشکرا دەست ئەکەن بەکۆکردنەوەی خەڵك و ڕێکخستنیان بۆ جەنگ، لە کاتێکدا هەموو دەزگاو ڕێکخراوە سەرکردێی یەکان ژمارەیان کەمە بەڵکو بە دزیشەوە خەریکی بەجێ گەیاندنی کاروباری خۆیان و ئەرکەکانی سەرشانیان بەرێوە ئەبەن.

## ٥ ـ جەنگی ناو خۆیی لە هەل و مەرجی لەباردا..

جەنگە ناوخۆیی یەکان کە هاوشانی شۆڕشە گەورە کۆمەلایەتیەکانە ئەهمیەتێکی تایبەتی لە مێژووی ئادەمیزادا هەیە، وەڕۆلێکی گەورە لە بواری پێشکەوتنی کۆمەڵدا ئەگێرێ.
جەنگە ناو خۆییەکانی ئەمرۆ کە بە بەشداری ملیۆنەها کەسی لە ئەندامی چینە چەوساوەکان دەست پێ ئەکات گەلێك بایەخی هەیەو نمونەی بی بەزەییانە ترین و توندو تیژ ترین قۆناغی ڕاپەرینی چینایەتی یە.
لە جەنگە ناوخۆیی یەکانی ئەم سەردەمەدا باری چۆنێتی چینە فەرمانڕەواکان لە قۆناغی سەرەتای جەنگەدا لە چینە ڕاپەرینەکان ئامادە ترو حازر بەدەست ترە، لەگەل ئەوەدا زۆربەی ئەندامانی چینە ڕاپەریوەکان شارەزای هونەری شەڕکردنن بەر لە دەست کردن بەڕاپەرین یان بەلای کەمەوە لەکاتی شەڕەکەدا کە ئەتوانن تا ڕادەیەك خۆیان پر چەك بکەن بەلام لەوانەیە لە سەرەتاوە دوچاری گیرو گرفت بن.
لە سەردەمی فەرمانڕەوایی بۆرجوازی یەکاندا مێژوو ئەوەئەسەلمێنێ کە جەنگە ناوخۆیی یەکان ماهیەتی خۆیان گۆڕیوەو ڕواڵەتێکی نێونەتەوەی بە خۆوە گرتووە، چونکە دەستەو کۆمەڵە دژ بە شۆڕشەکان لەگەڵ دەستێوەردانی دەرەودا هاریکاری ئەکەن و بەرەیەکی بەهێز لە دژی چینە شۆڕشگێڕەکانی وولات پێك ئەهێنن.
شەڕە ناوخۆیی یەکانی ١٧٨٩-١٧٩٤ و ١٨٤٨ و ١٨٧١ی فەرەنسەو ١٩١٨-١٩٢١ی روسیەو ١٩٣٦ی ئەسپانیا ڕوخساری دەستێوەردانی چەکدارانەی وولاتانی دەرەوەی ناو کاروباری ناوخۆی وڵاتەکانیانا تێك شکاوە.

بەم پێ یە بۆ ئەوەی خەڵکە پێشکەوتووەکانی ئەم سەردەمە بە ئامانجی خۆیان بگەن ناچاربن هەر دوا بە دوای ڕاپەرینی چەکدارانەدا **(کە لەکاتی سەرکەوتنیانا چینی فەرمانڕەوای کۆنە پەرست لەناو ئەچی)** پێویستە بەرامبەر ئەو سپاریکە و پێکەیی

ئ چەنـدان ساڵـە فێری سەرکردن و هونەری سەرکردن بووە، هێزو تواناى خۆیان دەرخەن و بنکەی سەرکردایەتی خۆیان بەرامبەر بە سەرکردایەتی لایەنەکەی تر ڕابگرن.

## ٦- عونسوره بنچینەیی یەکانی هەل و مەرجی لەبار بۆ جەنگی ناوخۆیی..

لەبەر ئەوەی عونسورە ساز شکارەکان لەو گێروگرفتانەی کە لەسەرەوە باسکران سوودیان وەرنـەگـرتـووە بەڕاسـتی لە تیۆری ڕاپەرینی چەکدارانەو (**لە ئەنجامدا جەنگی ناو خۆیی**) تێ نەگەیشتون، ئێستا لەبارەی گرنگترین عونسوری بنچینەیی کە لە هەل و مەرجی ئێستـادا لە بارە بۆچینـە شۆڕشگـێڕەکـان و دەسە بەری سەرکەوتنی ڕاپەرینی چەکدارانەو جەنگی ناوخۆیی ئەکات ئەدوێین:
بەو جۆرەی کە شۆڕشی ١٧٨٩ی فەرەنسەو جەنگی ناو خۆیی سەدەی حەڤدەهەمی بەریتـانیا سەلمـانـدویانـە کەچینی شۆڕشگێڕ لە دوا قۆناغی ڕاپەرینەکە یا نا ئەتوانێت هێزێکی بە توانـا بێك بێنێ کەلـە هەمـوو ڕوویەکـەوە (**بـەتـایبـەتی لە بارەی ئایـدۆلۆژی یەوە**) لە هێزی بەرامبەرەکەی بەتواناتر بێت. هەر چەند جەنگی ناو خۆیی درێژە بکێشێ ئەوەندە ئایدۆلۆژی دەستەو کۆمەڵە شۆڕشگێڕەکان گەشە تر ئەکات . بەقازانجی چینی پێشکەوتو قوڵتر ئەبێتەوە وخەڵکی زۆر تر ئەچنە ناو ڕیزەکانی شۆڕشەوە.

## ١- دوا ئەنجامی جەنگی ناو خۆیی..

**وا ئەنجامی جەنگی ناوخۆیی لەم سێ حاڵەتە بەدەرنیە:**
ان جەنگی ناوخۆ بە قازانجی چینی فەرمانڕەوای کۆن تەواو ئەبێت ولە ئەنجامدا دەزگا ەولەتی یەکان و ڕێکخراوە ئابوری یەکان وەکو خۆیان ئەمێننەوە (**وە ئەمە لە کاتێکدا ەبێت کە باری ئابوری بۆ سەرکەوتنی شۆڕش لە بارنەبێت و چینی شۆڕشگێڕ ەو هەل و مەرجانەیان تیا نەبێت کە لە پێشەوە باسمان کردن**).
ن ئەوەتـە جەنگی ناوخـۆیی بەسـەرکـەوتنی چینی پێشکەوتو کۆتایی پێ دێت و لە نجـامـدا ئەبێتە هۆی هێنانە سەرکاری سیستەمێکی ئابوری و دەزگاو ڕێکخراوی ەی کۆمـەڵایەتی (**وە ئەمـەش لە کاتێکدا ئەبێت کە هەل و مەرجی لەبار بۆ ەنگی ناوخـۆیی ڕەخسا بێت**) وەیان هەردوو هێزە دژ بە یەکەکە، هەریەکە یان شێك لە خاکی وولات بە دەستـەوە ئەگـرن و هەریەکـەیان دەوڵـەتی خۆی تیادا ـەزرێنێ (**ئەمە لە کاتێکدا ڕووئەدات کە گەشە کردنی باری ئابووری لەو**

ئابوری لەناوچەیەك پێك دێت و ناوچەكەی تریش لەسەر هەمان سیستەمی ئابوری كۆن وەكو خۆی ئەمێنێتەوە.

## ٨ ـ گەشە كردنی سەرمایەداری بە جەنگی ناوخۆیی كۆتایی پێ دێت..

لە كۆمەلگای سەرمایەداریدا (**بە تایبەتی لە قۆناغی ئیمپریالیزمدا**) لە ئەنجامی چەندان جەنگی یەك لە دوای یەك و درێژ خایەن، جەنگە ناوخۆییەكان چەندان هەل و مەرجی تایبەت پەیدا ئەكەن، بەوما نایە كە لەلایەكەوە ناكۆكی توندو تیژی هێزە بەرهەم هێنەرەكان لەگەل خاوەن بەرهەمەكان چەندان هەل و مەرج بۆ گەشە كردنی پرۆلیتاریاو ئایدیۆلۆژی شۆڕشگێرانە لەناو كۆمەلانی خەلكی ئەم چینەدا ئەخولقێنێ، وە لەلایەكی ترەوە شەڕە ئیمپریالیستی یەكان (**كە لە ئەنجامی توندو تیژی و گەشە كردنی هەمان ناكۆكی یە**) ئەبێتە هۆی لاواز بوونی بەرەكەی ناوخۆو دەرەوەی وولاتە سەرمایەداری یەكان،سەركەوتنی سۆشیالیزم لە وولاتێكدا، بەلام شۆڕشی سۆشیالیستی كە ئەبێتە هۆی لەناو بردنی بۆرجوازی سەركەوتنی سۆشیالیزم و مەرجی مانەوەی سیستەمی سۆشیالیستی و فەرمانرەوایی كردنی پرۆلیتاریا. . وە جەنگێكی ناو خۆیی سەخت و تارادەیەك درێژ خایەن لەگەلێ خۆیا دێنێتە كایەوە. بۆچی؟
لەبەر ئەوەی بۆرجوازی تێك شكاو بۆمانەوەی دەسەلاتی سیاسی خۆی ئەیەوێ سوود لەو كۆمەلە خەلكە رێك نەخراوانەو یارمەتی چەكداری دەرەوە وەربگرێ و هەموو شورەییەك ئەداتە لاوە. **لینین** ئەم راستی یەی بەدەست هێناوە كە (**رێبازی گەشە كردنی كۆمەلگای سەرمایەداری لە ئەنجامـدا هەر بە شۆڕشی پرۆلیتاری و پێك هێنانی كۆمەلگای سۆشیالیستی كۆتایی پێ دێت**)..
**وە لەم روەوە نوسیویە:**

**(لە بەرباری سەرنجی رێبازی پێشكەوتوانەی گەشە كردودا، لەبەر باری سەرنجی چینی پێشرەودا، تەنیا جەنگی دژی بۆرجوازی كە ئەتوانێت بەرامبەر جەنگی ئیمپریالیستی بۆرجوازی كە جەنگی دوا قۆناغی گەشەكردنی سەرمایە داری یە، كە پرۆلیتاریا لە پێناوی بەدەست هێنانی حوكم دژی بۆرجوازی بەرپای ئەكات راوەستێ، ئەمە هەمان جەنگی ناوخۆیی یە كەراپەرینی پێشكەوتوانە بەبێ ئەو جەنگە سەرناگرێ)**

**لینین**

# بەشی دووەم

# جەنگی ناوخۆیی لەبەرباری سەرنجی چینەکاندا

★ جەنگی ناوخۆیی چینەکانی لادێ.
★ جەنگی ناوخۆیی بۆر جوازی.
★ جەنگی ناوخۆیی پرۆلیتاریا.

## ١ـ جەنگی ناوخۆیی چینی لادێ.

لە هەمـوو هەل و مەرجێکی مێژووییدا. لە هەمـو ئەو ڕژێمە کۆمەڵایەتی و سیستەمە ئابوریانەدا، ڕاپەرین و جەنگی چینی لادێ بەچەند شێوازێکی جۆربەجۆر لە مەیدانی جەنگە چینایەتی یەکاندا خۆی نواندوە.

١) هەنـدێك جار چینـەکانی لادێ بزوێنەری بنچینەیی و لەڕیزی پێشەوەی جەنگە ناوخۆییەکاندا بوون.

٢) زۆرجـار جەنگی ناوخـۆیی ئەم چینـە وەکو بەشێکی جەنگی ناو خۆیی هەموو چینەکان بووە.

٣) لە زۆرکاتدا ئەبینرێ کەچینی ناوبراو تێکەڵ بەچینە جۆر بە جۆرەکانی ترو دەستەو تاقمە کۆمەڵایەتییەکانی تربون و بەپێی هەل و مەرجی ئابوری خۆیان و قازانجی ئەم و ئەو تێکـەڵاوی جەنگـی ناوخــۆیی بـوون، وەکـو جـەنگی لادێییـەکـانی ئەڵمان لە سالـی ١٥٢٥دا، ڕابــەڕینی لادێییـەکـانی شـۆڕشی گەورەی فەرەنسـە ، ڕابەڕینی لادێکــان لــە شۆڕشـی ١٩٠٥ و شـــۆڕشـی وولاتــی ڕوســـیەدا». لـەبـەر ئەوەی لە سەردەمی فیودالیزمدا بەتایبەتی لەو جەنگانەی

ڕاپەڕینی لادێ کان کارێکی گەورەی کردۆتە سەر چارەنووسی جەنگە ناوخۆییەکان وزۆربـــەی هێزی دەستـەوە شێنی ئەم جەنگـانـە بوون، ئێمـەش باری ئابـوری و کۆمەلایەتی و چۆنێتی جەنگەناوخۆیی یەکانی چینی لادێ **(لەم سەردەمەدا)** مەبەست لەکاتی جنگە ناوخۆییەکانە . باسی ئەکەین.
باری کۆمـەلآیەتی و ئابـوري چەوسێنراوەو چەوسێنەرەوەکانی ئەم سەردەمە تاڕادەیەك بەمجۆرە بووە.
١ـ سینـورەکان بۆ زۆرکردنی دەرامەتی خۆیان سودیان لەهەل و مەرجی ئابوری تازە وەرئـەگـرت، وەلەکاتی توندو تیژی بەرهەم هێنان و بێکاری لادێ یە (سرف)ەَ کانا هەولێ ئەوەیان ئەدا لەلایەکەوە بەهۆی زۆرکردنی کرێ ی ئیجازەی زەوی گەشە کردنی لادێیە نیوە ئازادەکان تێك بدەن و بیانکەنە (سرف)، وەلەلایەکی ترەوە بەهۆی دەس گرتن و بەخـاوەن بونی ئامـرازەکـانی ژیانی ئابـوری لادێ، زەوی و زارەکانبەبەیاری بهێلنەوە، بەو جۆرە ژمارەی لادێیە ئازادەکان کەم بکەنەوەو خۆیان ببنە خاوەنی زەوی وزارەکانیان.
٢) سینورەکان بە هەموو توانایەکیانەوە هەولێ ئەوەیان ئەدا کەبە هۆی دەسەلآتی فیودالی خۆیانـەوە ڕەوتی بەرەو گەشـەکـردنی ئابـوری کشتوکالێ کارە دەولەمەندەکانی لادێ، ڕابگرن و بیانخەنە ژێر مەودای گەشە کردنی ئابوری خۆیانەوە لەلادێکاندا.
٣) زیاد بونی بەیوەنـدی بازرگـانی و دارایی و گۆڕینەوەی زەوی و زار بەکەل و پەل لەلایەکەوە گەشەی بە مانۆ فاکتۆرەکانی فیودال دا وەلەلایەکی ترەوە چینی لادێ ی کرد بەدوو بەشەوە و ناکۆکی توند و تیژی لە ناوا خولقاندن وەکو:
١) دەولـەمەندان و سەرمایە بەدەستەکانی لادێ کەلەگەلێ پێشکەوتنی مانۆفاکتۆرەکانی فیودال و گەشەکردنی بۆرجوازی شارەکانا بەرەو لەناوچون ئەڕۆیشتن.
٢ـ هەژارەکانی لادێ کەلەگەلێ هەژار کەوتنی دەستەی یەکەمدا ژمارەی ئەمانە زۆرتر ئەبوو..
٤) لادێ یە (سرف)ەکان و نیوە ئازادەکان **(تەنانەت لە قۆناغێکی دیاري کراو ی گەشەکردنی فیودالیزمدا)** زۆربەی لادێ یە ئازادەکان لە ئەنجامی بێ بەش بونیان لەمافی سیاسی و نەبونی هۆیەکانی بەرهەم هێنان لە چوارلاوە ئەچەوسانەوەو لە ژیانێکی تالێ و سەخت دا ئەژیان وەکو:
١ـ چەوساندنەوەی ڕۆژانە لەلایەك و لەلایەن سینورە فیودالەکانەوە.
٢ـ ئەرکی سەرمایەدارەکانی شار.

٣ـ وەرگرتنی باج و ماهیاتی زۆر لە لایەنە کار بەدەستانی دەوڵەتەوە.
٤ـ پیتاکی بەزور لێ سەنراو بۆکلێسا ناوچەی یەکان.
ئەم خاسیەتە چوار لایەنیانەی سەرەوە بون بە هۆی ئەوە کە شۆڕش وڕاپەڕینی لادێ یەکان لە هەموو سەردەمە مێژوویەکانی سەدەی (١٥ـ ١٦ ـ ١٧) دابە جیاجیا ڕوبدەن.
ڕاپەڕینی شۆڕشگێڕانەی لادێ یەکانی ئەوروپای ڕۆژئاوا کەلەکۆتایی سەدەی ١٥ دا کەلە سوتاندنی کۆشکی پیاوە دەوڵەمەندەکان و کوشتنی خاوەن سامانەکانەوە دەستی پێ کرد لە سالی ١٥٢٥ دابوبە شەڕێکی گەورەی سەروماڵی لادێ یەکان.
لەم شەڕەدا کە زیاتـر لە دووسێ یەکی ئەڵمانی گرتەوە نەك تەنیا هەموو لادێ یەکان بەشداریان تیاکرد بەڵکو ئەو کەسانەش کەلەبۆر جوازی یەکان بێنراربوون و کرێکارانی شارەکـانیش **(کەلەکارگەکانی فیودالەکان خەریکی کاربون و بنچینەی چینی پرۆلیتاری تەواو بوون)** چونە لای شۆڕشگێڕەکان.
باری سەربازی و تاکتیکی شەڕی شۆڕشگێڕەکان لەوکاتەدا بەم جۆرە بوو:

١) چەکـی گەرم بەشـێوەی گشتی... **(چ لە ڕووی چۆنـیـەتـی وچ لە ڕووی چەندایەتي وە)** ئەوەندە پێش کەوتوبورکە دەورێکي کاریگەرانە لە جەنگی ناوخۆیی دا دیاری بکات.
٢) چەکی سارد کە گرنگترین چەکي شەڕەکە بوو هەموو کەسێ بە دەستیەوە بوو وە دروست کردنی ئەو جۆرە چەکانەش هیچ جۆرە گیروگرفتێکی تیانەبووا!
٣) لەشکـــری سینـورە فیودالـەکـان لە ڕووي چەنـدایەتي یەوە کەم بونـەوە دیســان سەرکردایەتیەکی ڕێك وپێکیشیان نەبوو، زۆربەی شەڕکەرەکانیان کرێ گرتە شاري و دێهاتی یەکان بوون.
٤) هەنـدێك لە خەڵکی لادێکان شارەزای هونەری شەڕی ئەوکاتە بون و بەئاسانی ئەیانتوانی بەرامبەری لەشکری فیودالەکان بوەستن.
٥) چەکي شۆڕشگێڕەکان بەزۆري وەك ویەك وابوون.
٦) ئەو ناکـۆکیانـەی کەلـەنێوان بنـەمـالـە فیودالیەکـاندا بوو زۆربەیان ئەبونە هۆی هەڵگـیرسانی جەنگی ناوخۆیی لە نێوانیاندا، دوبارە بوونەوەی ئەم جەنگەی نێوانیان لەلایەکەوە فیودالەکانی لاواز ئەکرد لەلایەکی تریشەوە ناحەزەکانیان زیاد ئەکردو پالێان ئەدا بەلەشکری تریشەوە واتە لادێ یەکانەوە.
بەڵام ئەو شەڕەگەورەی لادێکان لە سەدەی ١٦ هەمدا لەگەڵ ئەو هەل و مەرجە لە بارانەدا تێکـ شکا ئەویش لەبەر ئەم هۆیا نەبوو:

لە نێوانیاندا.

٢ـ لەبەرنبوونی بنکەی سەرکردایەتی لەهەمو ناوچەکانا زۆربەی دەستەو کۆمەڵەچەکدارەکان بە ئارەزووی خۆیانە ئەچوونە مەیدانەکانی شەڕەوە. بەجۆرە نەك تەنیا زۆربەی شوێنە گرنگە ستراتیجیەکانیان لە دەست داو گەمارو ئەدران بەڵکو لە کاتی پەلامار دانەکانا لەگەڵ یەکتری ئەبوە مشت و مڕیان تەنانەت لەگەل یەکتر ئەکەوتنە شەڕەوە.

٣ـ بۆر جوازی یەکان کە تازە گەشەیان کرد بوو لە سەرەتاوە لەگەڵ شۆڕشگێڕە لادێ یەکاندا وایان نیشان ئەدا کە هاریکاری یان لەگەڵ ئەکەن بەڵام لە کۆتایی دا بەپێ ی مەرجە ئابوری یەکان، بیرو بڕوای خویان گۆڕی و چونە ڕیزی بەرەنکاریکارانی شورشەوە.

٤ـ لاوازی ئابوری و سیاسی دەستە سەرەتایی یەکانی پرۆلیتاریا کەلەشۆڕشدا هەمیشە پاشکەوانی چینەکانی لادێ بون..

لەبەر ئەوە توانایان نەبو لە شۆڕشی چینەکانی لادێداڕۆڵی کاریگەرانەی خۆیان بگێڕن بە واتایەکی تر:

ئەوەندەی کە ناڕێکی ڕێکخراوەکان و جیاوازی باری سەرنجی چینەکانی لادێ بونە هوێ تێکشکاندنی شۆڕشەکەیان ئەوەندە لە شکری فیودالەکان دەوریان نەبوو لە تێکشکاندنەکەدا.

ڕاپەڕینی پوکاچێ کەلە ساڵێ ١٧٧٣ ـ ١٧٧٤ لە خوارووی ڕووسیا (بەشی ئۆڕال و ڤۆلگا) دەستی پێ کردوو هەموو ئەو ناوچانەی گرتەوەکە مەرجە ئابوری یەکانی کەلەبارەی ڕاپەڕینەکەوە لەباربو، لەڕیزی پێشەوەی جەنگەناو خۆییەکان ناو ئەبرێ:

ڕاپەڕینی پوکاچف لەسەرەتادا دەستی کرد بە سوتاندنی کۆشك و تەلاری خاوەن ملکەکان و ملکەکانی و یران کردن، هەر لە سەرەتاوە سەرکەوت، لە ماوەیەکی کورتا توانی هێزەکانی دەوڵەت یەك لە دوای یەك ڕاوبنێ بەرەو قەفقازو نیزنی کرۆدو مۆسکۆ بڕوات.

سەرکەوتنی شۆڕش خۆشی یەکی زۆری خستەدڵی کۆمەڵانی خەڵکی سۆڤیەتەوە، ڕۆژی چەندان کەس لە خەڵکی ناوچەکان و ئەندامانی سپای دەوڵەت ئەچونە ڕیزی شۆڕشگێڕەکانەوە.

ملكدارێتی لەلادێکاندا لاببات لەناوچوو جگەلە ناکۆیی نسبی نێوان چینەکان و هەڵەی هەندێك تاکتیکی سەرکردەکان، هۆی تێکشکانی ئەوڕاپەرینە وەکو ڕاپەرینەکانی ساڵی ١٥٢٥ ی جەنگی گەورەی لادێکانی ئەڵمان بوو.

**بەکورتی:**

هەموو ئەم ڕوداوانە نەبونی بەرنامەیەکی ڕێك وپێك و یەکیەتی تاکتیك و یەك نەگرتنی قازانجی خەڵك و نەبونی پەیوەندی چینایەتی توندو تۆل و ڕێبازیکی یەك نە گرتووی کۆمەڵانی خەڵکی لادێ نیشان ئەدات.

تێکشکانی ڕاپەرینە شۆڕشگێڕی یەکانی چینەکانی لادێ لە ساڵی ١٥٢٥ و ١٧٧٤ دا ئەوەنیشان ئەدەن کەناکۆکی ناوخۆی ئەم چینە خۆی لە خۆی دا بویە گەورەترین هۆی ژێرکەوتنی شوڕشەکەیان.

## ٢- شەڕی ناوخۆی ی بۆرجوازی..

بۆرجوازی گەشە کردوو کە لەناو کۆمەڵگای فیودالەوە هاتووەو لە داوێنی ئەم چینەدا پەروەردە بووە، لە یەکێك لە قۆناغەکانی گەشە کردنی خۆیا، **(لەو قوناغەدا کە ناکۆکی نێوان هێزە بەرهەم هێنەرە تازەکان و پەیوەندی بەرهەم هێنانی فیودال دا ئەبێتە هۆی ڕێگاگرتنی گەشە کردنی بۆرجوازی)** ناچارە بەمەبەستی سەرەو ژێرکردنی دە سەلاتی فەرمانڕەوایی فیودال و لەناو بردنی سیستەمی کۆمەلایەتی فیودالی ڕاپەڕین، لە دژی فیودال دەست بداتە شەڕی ناوخۆیی.

لەلایەکەوە جگە لە بۆرجوازییەکان هەموو چینە زۆر لێ کراوەکان هەر لە لادێ یی و پیشە گەورەوە تاکو سنعەتکارو بازرگان سود لەناو بردنی **فیودال وەردەگرن**. **لەلایەکی تریشەوە بۆرجوازیەکان (کەلەو کاتەدا کۆمەڵێکی کەم بون)** ئەوەندە توانایان نەبو کە بەتەنیا لە ڕووی سینورەکانی فیودال دا خویان ڕابگرن و بتوانن لە ناویان بەرن.

نەتوانین و خۆڕانەگرتنی بۆرجوازی یەکان لە بەرامبەر فیودال لە کان بوو بە هۆی ئەوە کە هانا بەرنە بەرچینە زەحمەتکیشەکان و داوایان لێ بکەن بەشداری ڕاپەرینەکانیان بکەن.

مەرجە ئابوری و کومەلایەتیەکانی فیودال ماوەی بە بۆرجوازی یەکان دا کە بەسەر سنیورەکانی فیودال دا سەرکەون.

بەلاّم بۆرجوازی یەکان لەگەلْ ڕوالەتی پێشکەوتوانەی خویاندا هەر بریتی بوون لە جینێکی چەوسینەرەوە، لە بەر ئەوە نەی ئەتوانی تاکو ئەنجامی دوا ئارەزووی خۆی سود لە پشتیوانی کردنی چینە چەوسینراوەکان وەربگرێ، جونکە دابەشبونی دەسەلاّتی سیاسی بەقازانجی ئابوری بۆرجوازی یەکان نەبوو، لەبەر ئەوە بۆرجوازی یەکان ڕێگای گەشەکردنی باری سیاسی هیچ چینێکی تریان نەئەدا.

لەبەر ئەوە چینەکانی لادێ و بۆرجوازی یە بچوکەکان لە هەمان ڕۆژگاری سەرەتایی گەشە کردنی کاپیتالیزمدا ناچار ئەبوون هەروەکو چۆن لە ڕووی دوژمنی کۆنی خۆیانا **(سینورەکانی ئیمپریالیزم)** ڕاپەڕین، هەر بەو جۆرەش لە دژی بۆر جوازی یەکان ڕاپەڕین.

**گرنگترین جەنگە ناوخۆییەکانی بۆرجوازی ئەمانەن:**

## ● جەنگی ناوخۆیی ئەسپانیا:

**یەکەمین جەنگی ناوخۆیی نەتەوایەتیانەی بۆرجوازی ئەو جەنگەیە کە ماوەی چل سالْ لە(١٥٦٨ ـ ١٦٠٩)** لە نێوان هۆلندی یەکان و Netherlands **(کە پێشکەوتوترین بۆرجوازی ئەو سەردەمەی ئەوروپابوون)** سەلْتەنەتی ئەسپانیادا **(کە بە هێزترین دەولەتی فیودالی ئەو سەردەمە بوون)** دەستی پێ کرد.

چالاکی پارتیزانانە کە لەسالْی ١٥٦٨ لە نێوان هێزە دژبەیەکەکان ڕویدا بەرە بەرە هەموو ناوچەکانی ئەسپانیای گرتەوە و بو بە جەنگێکی گەورەی ناوخۆیی.

ئەنجامی ئەم جەنگەناوخۆیی یەی ئەسپانیا بو بەوە کە بۆرجوازیەکان ناوچەکانی ژووری ئەم وولاّتە **(کەببوو بەمەیدانی چالاکی شۆڕشگێڕەکان)** پەیوەندی نزیك لەنێوانیانـدا دابمەزرێنن و دەولەتێکی سەربەخۆییێك بێنن وەبە هۆی یارمەتی دانیان لەلایەن ولاّتەکانی دەرەوە وەسپایەکی ڕێك و پێك و هێزێکی دەریایی دامەزرێنن بەکورتی کۆماری بۆرجوازی ناوچە یەك گرتووەکان کە پێی ئەلێن (هۆلەندە) پێك بێنن جەنگی ناوخۆیی نیوەی سەدەی ١٦ هەمی ئەسپانیا لە کۆتای دا گۆڕا بەجەنگێکی مەزهەبیانە، جونکە فیودالکان بۆ ئەوەی دوژمنەکانیان بشکێنن و خۆیان بە هێز بکەن سودیان لە ڕاگەیاندنی ئاینیانە وەرگرت. وە بۆ ئەوەی خەلکی سادەی پێ هەلبخەلەتێنن (کلێسا) یان کرد بەبنکەی شەڕو بگرەو بەردەی خویان.

## ● جەنگی ناوخۆیی ئینگلستان:

ئەو جەنگەی کەلەکاتی شۆڕشی گەورەی ئینگلستان دا لە نێوان **(شا)** و **(پەرلمان)** داهەلگیرسا، بەیەکێك لە جەنگە ناوخۆییەگرنگەکانی بۆرجوازی ناوئەبرێت.
لەم شەڕەدا **(کەلەسالی ١٦٤٢ دا سەرەتا لەلایەن شاوە دەستی پێ کرا)** پەرلمانی شۆرشگێر توانی بەهۆی باروزەمینەی لەباری ئابورییەوە کاروباری وولات لەدەست سەلتەنەتی زۆرداری وەربگرێ و دەزگا دەولەتیەکان بۆ کاروباری خۆی ئیش پێ بکات.
جەنگی ناوخۆیی بۆرجوازی ئینگلستان بەلە ناوبردنی ڕویا لیستەکان **(سەلتەنەت خوازان)** و داگیرکردنی سکوتلەندە **(کە دەورێکی گەورەی لە جەنگی ناوخۆیی ئینگلستاندا گێرا)** وەداگیرکردنی ئیرلەندە کۆتایی پێ هات . ئەم جەنگەش هەر وەکو جەنگی ناو خۆیی ئەسپانیا ڕوالەتێکی ئاینیانەی بەخۆوە گرت.

## ● جەنگی ناوخۆیی فەرەنسە:

جەنگی ناوخۆیی بۆرجوازی فەرەنسە لەسەردەمی شۆڕشی گەورەی فەرەنسەدا بەشێوەیەکی ئاشکرا سیفات و خاسیەتە تایبەتی یەکانی خۆی ڕوون کردەوە. لەسەرەتای ئەم شەڕەدا تویژە جۆر بەجۆرەکانی بۆر جوازی لەبەرامبەر دوژمنەکانی خۆیان **(سەلتەنەتی زورداری و دەست تێوەردەرانی دەرەوە)** بەرەیەکی بەهێزیان پێك هێنا و بەهەموو تواناکانیانە وەکەوتنە شەڕەوە. بەلام هەر چەند شۆڕش گەشەی کردبایە ناکۆکی چینایەتی بەرە شورشگێڕەکان ئەوەندە بەهێزتر ئەبوو تا ئەو ڕادەیەی لە قۆناغێکی گەشە کردنی شۆڕشدا قازانجی ئابوری و سیاسی بۆرجوازیە گەورەکان بەتەواوی کەوتەمە ترسی یەوە، لە ئەنجامدا ئەم چینە کەوتە بەرەی دژی شۆڕشەوە.
لەسالی ١٧٩٣ دا نزیکەی شەست کەس لە هەشتا کەسی ئەندامانی پەرلمانی فەرەنسە جیابوونەوە بەهاریکاری هێزە شۆڕش گێڕەکان کۆتایی بەجەنگی ناوخۆیی هێنا بەسەرکەوتنی خۆیان.
لە شکری شۆڕشگێڕی فەرەنسە لەدوای قەلاچۆکردنی هێزەکانی دژبە شۆڕشی ناوخۆ چالاکی خۆیان فراوانتر کرد و لەدژی ئەو دەستە و کۆمەلانەی دەرەوە کەلەکاتی شۆڕشدا پشتگیری دژی شۆڕشەکانیان کرد کەوتنە شەڕەوە، سەرکەوتوانە توانیان چەندان ناوچەی تر بگرنە ژێر دەست خۆیان و داب و دەزگای فیودالی تیا بپێچنەوەو ڕژێمی کۆماری تیا بەهێز بکەن.

بەمجـورة جەنگی ناوخۆیی فەرەنسە نەك تەنیا جەنگێك بووكە بۆرجوازی یەكان تیایا سەركـەوتوبن بەڵكو یەكەمین شەریش بوو كەلە ناو سنووری وولات كشایەدەرەوە و ڕواڵەتێكی نێو نەتەوەیی بەخۆوەگرت.

**سەركەوتنی جەنگی ناوخۆیی بۆرجوازی فەرەنسە** بەرلەهەموشت بەهۆی كانیزاسیۆنی سپای شۆڕشگێڕانەو چالاكی ئەم سپایەوە بوو.

**دوو ئینی گرنگ بەر لە هەمووشت لە** ڕیزی پێشەوەی سپای شۆڕش گێڕانەدان.

**یەكەم** پارێزگاری كردنی هێزە شۆڕشگێڕەكان لە دەست درێژی و بەلاماردانی هێزەدژبە شۆڕشەكان،

**دووەم** زامن كردنی قازانجی بنچینەیی و سەركەوتنی بنچینەیی دەستەو كۆمەڵە پێشكەوتوەكان.

**ئەو جەنگانەی كە بۆر جوازی یەگەشەكردو وەكان لە دژی فیودالی و هاوكارەكانیان لە دەرەوەی وولات هەڵیان گیرسان** زۆربەی بەناوی نیشتمان پەروەرێتی و پاراستنی نیشتمان بوون بەم جۆرە بۆرجـوازی فەرەنسـە شۆڕشی خۆی دەست پێكـرد. بۆرجوازییەكان پێچەوانەی فیودالەكان بوون كە كادێرە سەربازی یەكانی یان بریتی بوون لە لەكرِوكاڵێ دەرەبـەگ و خاوەن مڵكـە دەربارییەكان،بۆرجوازیەكان ڕێگایان بەنەوەی هەموو چینە شۆڕشگێڕەكان ئەدا كەڕۆڵێكی سەركردایەتی خۆیان لە شۆڕشەكەدا بگێڕن.

## ● جەنگی ناوخۆیی بۆرجوازی چین..

**نەك تەنیا بۆرجـوازی وولاتـە سەربـەخـۆكـان** بەڵكـو بۆرجوازی ئەو وولاتانەی نیوە سەربەخۆو ژێر دەستە دیسان لە قۆناغێكی تایبەتی گەشەكردنی ئابووری خۆی دا بتەوێ ئالای ڕاپەڕینی ناوخۆیی لەدژی فیودالیزم بەرز ئەكەنەوە.

ئەگـەرچی شۆڕشی بۆرجـوازی ١٩٠٥ لە روسیە ئەویش لە قۆناغێكی ئیمپریالیستانە دابوو، بەڵام چین بە پێچەوانەی روسیاوە لە هەمولایەكەوە كەوتبوە بەرزەبری توندوتیژی ئیمپریالیستەكانی دەرەوە.

زۆر وستەمی ئیمپریالیزم لە سالەكانی ١٩٢٠ - ١٩٣٠ دا ئەوندە زۆربوو كەنەك تەنیا هەمـوو زەحـمـەتكێش و چەوسـاوەكـانی چین ئالای شۆڕش بەرزبكـەنـەوە، بەڵكـو بۆرجـــوازییەكـــانی ناوخـــۆش تاقـــۆنـــاغێكی دیاریكـراوی شلۆڕش دروشمی دژی ئیمـپریالیزمیان هەڵگـرتبـوو ولـەجـەنگـە شۆڕشگـری و ئازادی خوازییەكـانی گەل داهاریكاری خەڵكی لادێ و كرێكارەكانیان ئەكرد كە ئەمانەناوكی شۆڕشەكە بوون.

شۆڕش و جەنگی ناوخۆیی بۆرجوازی چین بەکورتی وەکو لای خوارەوە بوو:
لە ۳۰ مەی ۱۹۲۵ دا **لەشانکهای** کۆمەلانی خەلکی کریکار مانگرتنی گشتییان دەست پێ کرد.
لەهاوینی ۱۹۲٦ دا دەولەتی نیشتمانی و شۆڕشی چین کەلە سەردەمی ژیانی (سن یات سن) لە کانتن دامەزرابوو توانی بە پشتیوانی کۆمەلانی خەلکەوە جەنگ لەرووی دژبە شورشەکانا بەرپابکات وە حیزبی کۆمونیزمی چین یارمەتی مادی و مەعنەوی ئەدان.

سپای شۆڕشگێڕەکان لە ماوەیەکی کەمدا چەند ناوچەیەکی سنعەتی چینی ناوەندیان ڕزگارکردو لەدوای داگیرکردنی **جانشای ئوخان تانکن** لەمانگی مایسی ۱۹۲۷ دا بە پشتیوانی پرۆلیتارەکانی شانکهای یەوە ئەم شارەگەورەیە شیان ڕزگار کرد.
بەسەدان ملیۆن کۆمەلانی خەلکی زەحمەتکێش و زۆرلێکراوی چین کە چەندان سال بوو لەخەوی نەزانین دابون و بەزۆری چینی فەرمانرەوای ناو خۆخزمەتی قازانجی ئیمپریالیزمی دەرەوە یان ئەکردو ئەیان پاراست و هەموو ڕابەرین ویەکیان گرت.
ئەو جەنرالە لەشکری یانەی چین کەلە پێناوی بەدەست هێنانی پلەو کورسی بەرزدا بوبونە پیاوی بێگانەکانی دەرەوە ریسوا بوون وماهیەتیان بۆ کۆمەلانی خەلك دەرکەوت.
دەسەلات و بەرەی نیشتمانی حزبی کمۆنیزم لە نێوان کومەلانی خەلك دا فراوانترو ئاشکرا تر بوو.
هەل و مەرجی لەبار بۆ فراوانبونی مەودای شۆڕشی ئازادیخوازانەی خەلك رەخسا.
خەلکە زۆر لێکراوەکانی هیندوچین ئاگاداربونەوە و بیری ئازادی خوازانەیان بە هێزبوو.
جەنگی ناوخـۆیی بۆرجـوازی چین بە ئەنـدازەیەك فراوان بوو تارادەیەك ئەهمیەتی پەیداکـرد کە ئیمـپریالیستـەکانی دەرەوە ناچار بون بە ئاشکرا چەندان هێزی گرنگی خۆیان لەو ولاتەدا مۆل بدەن و بیدەن بە دەست میلیتاریستەکانی ناوخۆو بەهاریکاری بۆرجوازی چین بەرەیەکی یەکگرتوو لە دژی شۆڕشگێڕەکان پێك بێنن.
دوژمنـانی دەرەوە بەوە شەوە ڕانەوەستان بۆمب بارانی نانکن و بالیۆزخانەی سۆڤیەتیان کرد. جەنگی ناوخـۆیی چین بەهـۆی سەرکـردە سپـاییە خیانە تکارەکان وبەتایبەتی جەنـرال جانکا شیك دوچاری مەینەتیوشوستی بوو. لەدوای شکستی شۆڕشگێڕەکان ڕاپەڕینی کریکاری لێك هەلوەشانەوە.
ئیمـپریالیستەکانی دەرەوە بە پشتیوانی جەنرالەکانی ناوخۆ بالیان کێشا بەسەر کۆمەلانی خەلکی چین دا ولـەپاداشی ئەم کارەداهەر جەنرالێك لەو خیانەتکارانە پارچە زەوی یەکی پێ درا.

له دوای تێکشکاندنی ئەم جەنگە سەر لە نوێ جەنگێکی تازە سەری هەڵدایەوە، بەڵام ئەم جەنگە ئەوە نەبوو کەلە دوای تێکشانی ڕاپەڕینی ئازادیخوازانەییەوە سەرهەڵ بدات، جەنگێك بو لە نێوان جەنراڵەکانی چین دا وەکو (جانکا شیك، فین یون سان، تان شن جی و ئەوانی تر) هەڵگیرسا کەهەریەکەیان داکۆکی لەسەر قازانجی وڵاتێك ئەکرد وەکو: (ئەمریکا، زابون، ئینگلیز)

لەناو ئەو جەنراڵانەدا جانکاشیك کەزۆرتر نۆکەری ئیمپریالیزمی ئەمەریکا بوو سەرکەوت بەڵام دیسان ئەویش کەوتەوەبەر مەودای کاریگەرێتی شۆڕشی ئازاد یخوازانەی خەلکی چین و بەهاوی هەیت دەرکەوت و ریسوابوو.

هەموو ئەم ڕاستیانە مانای ئەویە کە شۆڕشی چین تا ئێستا نەکوژاوەتەوەو بەردەوامە [1]

## ● جەنگە ناوخۆیی یەکانی پرۆلیتاریا:

لەمەوبەر وتمان کە ڕاپەڕینی چینایەتی شان بەشانی ناکۆکی یە چینایەتی یەکان گەشە ئەکات وە لە قۆناغێکی دیاری کراودا ئەبێتەشۆڕش .

جەنگە ناوخۆیی یەکانی، پرۆلیتاریا کە دواقۆناغی گەشەکردنی ڕاپەرینی چینایەتییە ، جەنگێکە کە پرۆلیتاریا لەکاتی شۆڕشی سۆشیالیستییانەدا وەیان هەر دوابە دوای شۆڕش دا دەست پێ ئەکات، وەئەیەوێ لەو ڕێگای شورشەوە هەموو چینە چەوسێنە رەوەکان (هەر نە سەرمایەداری سفەتییەوە تاکو بۆ رجوازی لادێ و خاوەن مڵك و هەموو شوێنە وارەکانی فەرمانرەوایی فیوداڵەکان) لەناوبەرێت .

تاقیکردنەوەیی چینی کرێکارانی وڵاتەکانی فەرەنسە ـ ئەڵمان ـ مەجەرستان و روسیە ڕواڵەتی سیفەتی جەنگی ناوخۆیی پرۆلیتاریا و چۆنێتی جەنگەکە نیشان ئەدەن .

پرۆلیتاریا لە جەنگی ناوخۆیی دا (**کەلەدژی دەزگا زۆرداری یە کانی بۆرجوازی ئەیکات**) ناچارە کە چاوپۆشی لەڕوخاندنی هیچ ڕێکخراوێکی کۆمەڵایەتی کۆنەو هیچ

---

(١) لەوتارێکی ساڵی ١٩٢٩ی داوەرگیراوە.

بەڵێ «چینی شۆڕشگێڕ بەرابەری پرۆلیتاریای خۆی هێزەکانی خۆی ڕێك ئەخات و بەمەبەستی ئازادی خۆی سەرلەنوێ دەست ئەکاتەوە بە ڕاپەڕین»

«ستالین»

شوێنەوارێکی گەشەکردوی فیودالی و هیچ فۆرم و جۆرێکی چەوساندنەوە **(کەم بێ یان زۆر)** نەکات. بەمجورە پرۆلیتاریا ناچارە لە پێناوی لە ناو بردنی چینە زۆردارەکان ڕێگـای خۆماڵی کردنی دەزگا بازرگانی و سنعەتیەکان ، ڕێگای خۆماڵی کردنی بانقەو دەزگاکانی بارکردن و گواستنەوە بگرێتە بەروکاری گەشەکردنی بۆرجوازی نەدات.
ئەم کردارە مێژوییە یانە کەڕواڵەتێکی نێو نەتەوەییە یانەیان داوە بەشۆڕشی پرۆلیتاریا.
هەر جەنگێك ئەمـرو کەلـەولاتێکـدا لە نێوان هێزە زەحمـەتکێشـەکـان و چینـە کۆنە بەرستەکان دا ڕوبدات بەحەتمی ئەبێتە جەنگی جیهانی.
ئەو شەرەی کەپرۆلیتاریا دژی کۆمەڵی بۆرجوازی ئەیکات گەلێك سەخت ترو توندوتیژ ترە لەوشەڕەی کە بۆرجوازی لەدژی فیودالی ئەیکات.
ئەو جەنگـانـەی پرۆلیتاریا کەتائێستە ڕویان داوە وچینە چەوساوەکان بردویانەتەوە لە کاتێکدا بووە کە بۆرجوازی ناوخۆ لە شەڕی ئیمپریالیستی دا دۆڕاندویەتی.
بۆرجـوازی لەوجـۆرە جەنگـانـەدا ناچـارە بەزۆری کۆمـەلا ی خەڵـك کۆبکاتەوەو پرچەکیان بکات.
جەنگی ١٨٧٠-١٨٧١ی فەرەنسە لەگەڵ برۆسی کەبوو بەهۆی تێکشکاندنی هێزی فەرەنسە. . ، ئەو کرێکارانەی کە چینی فەرمانرەوا بۆ داکۆکی کردن و پاراستنی پاریس پرچەکی کردبون دەسەلاتی دەوڵەتیان گرتە دەست و و بەدامەزراندنی کۆمۆن بنچینەی فەرمانرەوایی بۆرجوازیەکانیان تێك دا.
تێکـشکـانـدنی وولاتـەکـانی روسیەو ئەلمـان و ئەتـریش و مەجـەرستان لە جەنگی ئیمـپریالیستی ١٠٤-١١٨ بو بەهـۆی پرچـەك کردنی کرێکـاران و لادێییەکان وە لە ئەنجامدا دژی بۆرجوازی یەکان وەستان.

## ● سیاسەتی چینی کرێکار لە جەنگی ناوخۆیی پرۆلیتاریادا:

بەپێی ئەو مەرجانەی سەرەوە ئەو گیروگرفتەی کەپرۆلیتاریا ناچـار ئەکات درێژە بە جەنگی ناوخۆیی بدات لە پێناوی نەهیشتنیان هیچ دوود لێ تیانـامێنیتـەوە کەسیاسـەتی پرۆلیتـاریاو حزبی پرۆلیتـاریا لە سەرکـەوتن **(یـان تێـك شکاندنی)** جەنگی ناوخۆیی چینی کرێکاردا ڕۆلێکی گەورە دیاری ئەکات.
پرۆلیتاریا لەو شەڕە سەختەدا کە لە ڕووی دەسەلاتی کۆمەڵی سەرمایە داریدا **ئەیکات** بیانەوێ و نەمانەوێ ناچار ئەبێ لە پێناوی سەرکەوتن و بەهیز کردنی پشتی بەرەکەی شەڕەوە، وە لەپێناوی شکاندنی تەواوی دوژمندا دەستی هاریکاری بۆ هەموو چینە زۆر

کێشێته ناو جەنگەوە . .
لە وولاتــە سەرمایەداری یەکان کەشۆڕشی **بۆرجوازی دیموکراسی** لەسەر چەندان مەرجی ئابـوری مام ناوەنـدی لادێکـان کەوتـە مەتـرسی یەوە ڕاپـەڕین کەوتە نێوان بورجوازی و پرۆلیتاریاوە .
لە شۆڕشی ئۆکـتـۆبـەری ڕوسیادا کە هەموو چینەکانی لادێ لە یەکەمین مانگەکانی شۆڕش داله شەڕێکدا کەلەگەڵ سپای سپیدا واتە(**دژ بەشۆڕشەکان**) ئەیانکرد لە دژی :
١ـ تازەکردنەوەی دەسەلاتی خاوەن ملکەکان .
٢ـ داوای یەکسـانیو هاوبـەشییان ئەکـرد . . بـەلام شان بەشـانی فراوانبونی شۆڕشی سۆشیالیستی ڕوسیا جگە لە بۆرجوازی لادێ چەندان دەستەو کۆمەڵی تری نیشتمانی بەشداری جەنگی ناوخۆیی پرۆلیتاریایان کرد .
لەم جۆرە ولاتەتانەدا پێویستە پرۆلیتاریا سیاسەتێك بەکاربێنێ کەسـەرنـج وڕای کەمـایەتیە نەتـەوەییەکان بۆلای خۆی ڕابکێشێ لینینیزم مەسەلەی نەتەوایەتی وەك وبەشێك لەمەسەلەی شۆڕشی پرۆلیتاریا سەیر ئەکات دیسان ، لینینیزم کەمـە نەتـەوایەتیەکـان و ئەو نەتـەوانـەی ئەچەوسێنەوە وەك و کەرستەی پرۆلیتاریای نێونەتەوەی سەیریان ئەکات . وەدا وا ئەکات کەچینی کرێکارلەو ڕاپەڕینەیدا کە دژی ئیمـپریالیزم ئەیکـات و ئەیەوی فەرمانڕەوایی پرۆلیتاریا سەرکەوێت پێویستە سودلەو کەرەسە پوختانە وەربگرێ .
تا ڕۆژگـاری بەرلـە پەیدابونی قۆناغی ئیمپریالیزم مەسەلەی نەتەوایەتی لە ناوسنوری ولاتێکی جیاوازی چەنـد نەتـەوەیی دەرنـە ئەچوو بەلام ئەمرۆ مەسەلەی نەتەوەکان لەوسنورە دەرچووە و نەتەوە زۆر لێکراوەکانی هەرولاتێك نەك تەنیا لە دژی زۆر دارانی سەرمایەداری بەلکولەدژی سیاسەتی ئیستعماری نێو نەتەوەییو دژی ئیمپریالیزمی جیهان ڕائـەپـەڕن و پرۆلیتـاری وولاتـە سەرمایەداریەکان پێویستە ڕاپەڕینی خۆیان لە گەڵ ڕاپەڕینی ئازادیخوازانەی نەتەوە ژێر دەستە کانیان یەك بخەن وبەهەموویان ڕاپەڕینێکی بەهێز لە دژی ئیمپریالیزم بهێننە کایەوە ! :

## سپای چینی کرێکاران لەجەنگی ناوخۆیی پرۆلیتاریادا . .

یەکێك لەو هۆیە گرنگانەی کەلە سەرکەوتن یاژێر کەوتنی جەنگی ناوخۆیی پرۆلیتاریادا دەور ئەگێڕێ مەسەلەی سپای شۆڕش گێڕانەو تاکتیکی ئەم سپایەیە ، جۆری دامەزراندن .

گەشەکردنی هەر سپایەکی پرۆلیتاریا بەجۆرێکە ، بۆ نمونە سپای پرۆلیتاریای ڕوسیە کەلـەقۆناغی سەرەتای شۆڕشەکەدا زۆرکەم بوو، زۆربەی چەك هەلگرەکانیان کۆنە سەرباز بون. وەلەکۆتایی ڕاپەڕینی ناوخۆدا زیاتر لە پێنج ملیۆنا و نیو چەك هەلگربوو کە هەموو کارامەو تاقیکراوەی چینەکانی **(کرێکاران و خەلکی لادێ)** بون.
لە ١٨ ی مارسی ١٨٧١ کۆمۆنی پاریس سپایەکی ڕێك وپێکی شۆڕشگێڕی هەبوو کەبەشێکی گرنگیان لەو گاردە نیشتمانە نیانەبون **(کەلەکاتی گەمارۆدانی پاریس دا لەلایـەن چینی فەرمـانرەوای فەرەنسەوە پرچەك کرابون بۆ ئەوەی شارەکە بپارێزن ومباشترین جۆری چەکیان پێ بوو)**.
سپای کۆمۆن ئەیتوانی لە ماوەیەکی کەمدا ورسای بگرێتە ژێر دەستی خۆیەوە و دەولەتی بێ پایەی بۆرجوزییەکان لە ناوببات.
بەلام کۆمـۆن بەتـونـدو تیژی نەجولایەوە، هەلوێستی داکۆکی کاری بەرگری یانەی بۆخۆی هەلبژارد، بەم هەلە گەورەیە ماوەی بە دەولەتی بۆرجوازی ( **تیر** ) داکەهێزە لەیەك هەلوەشاوەکانیان کۆبکەنەوەو سود لەودیلە جەنگییانە وەربگرن **(کە ئەمەلان بۆ سەرکوت کردنی دەولەتی پرۆلیتاری بەرەلالای کردبون)** وە هێزێکي گەورە پێك بێنن ولە ناکاو پەلاماری هەموو ناوچەکانی پاریس بدەن و خوێنی هەزاران کرێکاری فەرەنسەیی تێکەلا بە خاك بکەن.
ئەوتاقی کردنەوەی کۆمۆنی پاریس هەمیشە وەکو سەر مەشقی پرۆلیتاریای ڕوسیەبوو، لە شۆڕشی ئۆکتوبەرا چینی کرێکاری ڕوسیە چاوپۆشی لە هیچ پەلامار دانێك نەکرد تاك و لە ئەنجامدا سەرکەوت و توانی هێزەکانی دوژمن یەك لە دوای یەك لەناوببات، وە بنجینەی ز... ـتەم لەژتاسەری خاکی ڕوسیەدا ڕیشەکێشی بکات.
جەنگـە ناوخـۆیی یەکـانی پرۆلیتـاریا چەنـدان لاپەڕەی تازەو درەوشاوەی لە مێژوی گەشـەکـردنی ئادەمیزادا هێناوەتە کایەوە، گەشەکردنی سەرمایەداری و جەنگە یەك لە دوای یەکـە ئیمـپریالیستی یەکان و توندوتیژی ناکۆکی نێوان هێزە بەرهەمهێنەرەکان و هێزە، بەرهەمدارەکان وزۆربونی ڕابەڕینی چینایە تیانە ئەمانە هەموو کۆمەلە هۆیەکی گرنگـە کەبەشێوەی حەتمی ئەبنە هۆی ڕودانی شۆڕشی سۆشیالیستی و سەرەو ژێرکردنی فەمانرەوایی و بۆرجوازی.
هەر شۆڕشێکی سۆشیالیستی یانەو، هەر ڕابەڕینێکی شۆڕشگێڕانەی پرۆلیتاریایی و هەر ڕابـەڕینێکي ئازادیخـوازانەی گەل لەئەنجامدا هەر ئەبنە دەست ئاگرسێنی جەنگێکي ناوخۆیی گەورە.

# بەشی سێ یەم

## « جەنگی ناو خۆیی لە بەر باری سەرنجی سۆشیالیزمی زانستی مارکس دا»

مارکسیزمی زانستی بەپێ ی یاسای ماتریالیزمی دیالکتیك ئەوە ئەخاتە بەر چاوکە گۆڕینی فرماسیۆنێکی کۆمەلآیەتی بە فرماسیونێکی کۆمەلآیەتی تر نایەتەدی ئەگەر لە رێگای شۆڕشەوە نەبێت. وەئەم(شۆڕشەش)هیچ روخسارێکی دەرەوەی نابێت، مەگەر لە کاتێکدا کۆمەلێ تازە بەپێ ی گەشەکردنی خۆی هەموو ئەومەجانەی کە بۆ گۆڕینی کۆمەلێ پێویستە لە ناو دەرونی کۆمەلێ کۆندا خولقابێت.

مارکس و ئەنگلس لە یەکەم نوسینی بابەتی تیۆری خۆیانا باسی جەندان فۆرم و شێوازی جۆربەجۆر یان کردووە، کە پرۆلیتاریا تەنها لە رێگای شۆڕش و چەك هەلگرتنەوە ئەتوانن پایەی فەرمانڕەوایی خۆیان لە سەر کەلاوەی فەرمانڕەوایی بۆ رجوازی دا بمەزرێنین.

کومۆنی پاریس واتا شۆڕشی پرۆلتیاریای جیهان بەپێ ی نەخشەی دووربینی سیستەمی کۆمەلآیەتی سۆشیالیزم وبەپێ ی سەلماندنی یەکجارەکی جەنگی ناو خۆیی پرۆلیتاریا وبەپێ ی باری سەرنجی مارکس و ئینگلس ئەو ڕێگایەیی نیشان دا کە پرۆلتیاریا تەنیا بە حوکی چەك ئەتوانێ ئازادی سیاسی خۆی بە دەست بێنێ.

ڕابەرانی حزبی کرێکاری یەکانی نێو نەتەوەیی دووەم شێوازی شۆڕشگێڕانەی تیۆری کارل مارکس و هەموو شێوازو یاسەکانی تر یان داوەتەلاوەو هەولێ ئەدەن کە شۆڕشی سۆشیالیستی لە جەنگی ناو خۆیی دابڕکەن، ئەوانە لە خۆوە خۆیان ماندو ئەکرد و هەولێان ئەدا کە تاکتیکی شۆڕشگێڕانە بگۆڕن بە سیاسەتی سازشکارانەی خۆیان وەچینی کرێکار هان بدەن کە لە ڕێگای پەرلمانەوە داوای مافی خۆی بکات.

ڕیفـور میستەکانی ئەو سەر دەمە هیچ شەرمێکیان لە گۆڕینی وە دەسکاری تیۆری و نوسینی زاناگەورەکان نە ئەکردوە تیۆەری یەکانیان بە هەڵە لێك ئەدایەوە بە تایبەتی لە بارەی ئەو بۆ جونانەوە کە ئینگلس لە پێشەکی «ڕاپەڕینی چەکدارانە» دا دەری بڕیوە، وەسەر بەخۆ هەوڵی ئەوە یان ئەدا کە ئەم پاڵەوانە هەڵکەوتوە شۆڕشگێڕە وەکو کەسێکی سازشکارو ڕیفۆرمیست بخەنە بەرچاو.

ئەگەرچی لە هەندیك لە پێشەکی یەکەی ئینگلس دا چەند مەرجێکی بۆ سەرکەوتنی ڕاپـەڕینی چەکدارانەو جەنگی ناوخۆیی پرۆ لیتاریا داناوە بەلام هیچ کەس ناتوانێت بەپێی ئەو مەرجانە بیروباوەری شۆڕشگێڕانەی ئینگلس لێل بکات.

لە سالە سەر ەتاییەکانی سەدەي بیستەمدا کە شەڕکردنی ئیمپریالیز م و وولاتە سەرمایە داري یەکان لە چەکی جەنگی و جەنگی جیهانی بەشێوەیەکی ،ڕون وئاشکرا نیشان داوە.

سنترالیستەکان کە بەرابەری کاوتسکي لە نێونەتەوەیی دووەمدا ژمارە یان زۆر بوو لە کاتي جەنگی تیۆریانەدا کە ئەپۆر تونیستە کان بەرامبەر بە جەنگی ناوخۆیی ئەیان نواند لایەنگـیري ئەکـردو هەولیان ئەدا بیروبـاوەرو ریفورمیستی خۆیان بە چەندان واتای شۆڕشگـێڕانــە بڕازێننـەوە وپەردەی ڕوپـۆشی بیادەن لە راستی دا حزبـە سۆشیالـ دیمـوکـراتـەکانی نێو نەتەوەیی دووەم بەپێ ی قایل بونیان بە چالاکی یاساییانە چینی کرێکاریان لە یەکەمین جەنگی ڕزکار یخوازنەی،کەتیۆری شۆڕشگێڕانەی مارکسیزمە پێ بەش کرد.

سەر کردەکانی نێونەتەوەیی دووەم بە ئینکاری کردنی شۆڕشی سۆسالیستی و حەتمي بوني جەنگی ناو خۆیی و ئینکاری کردنی پێویستی ڕوخاندن ، چەندان دەزگای سیاسی جۆر بە جۆرو فۆرمی هەمـە چەشنـەی ئابـوري بۆ رجـوازی، کە ورەترین خیانەتیان بە پرۆلیتاریا کرد. وەچەندان حزبی پرۆلیتاري یان کردبە حزبی کرێکاراني بۆر جوازي. لە کاتي جەنگي ئیمپریالیستي یانەی ١٤ـ ١٨ ١٩دا نێو نەتەوەیی دووەم دوا باشقولی خۆی لەمەیداني جەنگی ناو خۆیی دا لە دژي مارکسیزم نواند. بەو مانایەکە بە پێ ی ناو بژی کردنی.

ناوخـۆیی چارەنـوسی کرێکـار بداتـە دەست ئاوات و ئارەزووی بۆرجوازی یەکان.

وەهـەنـدێك لەسـەرکـردەکانی حزبە سۆشیال دیموکراتەکان هەولی ئەوەیان ئەداکە لە شەڕێکی ناوخۆییدا دەسەلاتی چینی بۆرجوزی لە شکاندن و مردن ڕزگارکەن. بۆنمونە لەکاتێکدا کەهێزەکانی ئەلمانەکە لە شەڕی ١٤ ـ ١٩١٨ داتیك شکاو شۆڕشی ناوخۆ هەڕەشـەی لە چینی فەرمـانـڕەوای وولات ئەکرد کە لە ناویان ببات کاوتسکی ئەوەی

بڵاوکردەوە کە جەنگی ناوخوبی دوژمنی سەرسەختی شۆڕشە ، جونکە شۆڕش پێویستی بە ئارامی و ئاشتی هەیە . .
لە سەردەمی فەرمانڕەوایی نێو نەتەوەیی دووەم دا بلشویکەکان تاڕادەیەك یەکەمین کۆمەڵ و حزبێك بون کە ئاڵای مارکسیزمی شۆڕشگێڕانەیان بەرز کرد بووە .
ڕوخساری شۆڕشی ١٩١٥ی روسیە بە شێوەی تایبەتی ئەوەي دەرخست کە هەمو تیۆری فراکسیۆنە بلشویکەکان و هەموو چالاکی ستراتیجی و تاکتیکی یان بشتی بە جەنگی ناوخۆیی ئەبەست .
بلشویکەکان چ لە ساڵی ١٩٠٥ وچ لە ساڵی ١٩١٧دا ئەوەیان نیشان دا کەنایانەوێ نەخشەو بیری خۆیان تەنیا لەسەر ڕووی قاقەز دەربڕن وەهەمیشە و لەهەموو حاڵەتێکدا تیۆری خۆیان پاراستوە .
لینین لەم ڕووەوە وتویە : لەکاتێك کە مێژوو فەرمانڕەوایی پرۆلیتاریا بەبەشێك لەمەسەلە پێویستی یەکانی ڕۆژدائەنی جەنگی ناوخۆیی لەوکاتەدا تەنیا ڕێگایەکە کە مەسەلە گرنگەکانی سیاسەت چارەسەر ئەکات .
لە مانگە سەرەتاییەکانی جەنگی ١٤ ـ ١٩١٨دا لە کاتێکدا کەنێونەتەوەیی دووەم دوو چاری گیروگرفتی کۆنەپەرستانە بوبون وە حزبی سۆشیال ـ دیموکرات ڕواڵەتێکی سۆشیال ـ فاشیزم و سۆشیال ـ شۆڤینیزم و سۆشیال پاتریۆنیزمی بەخۆ وەگرتبوو لینین تەنیا کەسێك بوو کەمەسەلەی گۆڕینی جەنگی ئیمپریالیستی بە جەنگی ناوخۆیی کرد بەسەردێڕی سیاسەتی خۆی .

**لینین لە گەرمەي جەنگی ١٤ ـ ١٩١٨ دا وتویە:**

«گۆڕینی جەنگی ئیمپریالیستی بەجەنگی ناوخۆیی یەکەم دروشمی پرۆلتاریایە . کەکۆمۆنی پاریس نیشانی داوە وە لەبڕیارنامەی بازل لە ساڵی ١٩١٢ دا مۆرکراوە ، کەیەکەمین دروشمی ڕاستی پرۆلیتاریا یە ، کە لە ئەنجامی هەموو مەرجەکانی جەنگی ئیمپریالیستی داکەلە نێوان وولاتە گەشە کردوەکانی بۆرجوازی دا ڕوئەدات دێتە دی .
دروشمەکانی لینین لەبارەي فراوان بونی مەودای ڕاپەڕینی کرێکارانی دنیاوو ڕۆڵێکی گەورەی گێڕاوە .

لینین لەووتارو دروشمەکانی خۆیا جەنگە یمپریالیستەکانی وەها لێك داواتەوە کە ئەنجامی ئەو شەڕانە سەرکەوانەبێت یان ژێر کەوتوانەبێت بەنیسبەت کرێکارانەوە ئەنجامیان تاڕادەیەك هەروەکویەکە هەر هەژاري و برسێتي و بێ ماف یان بۆ ئەمێنیتەوە

وەتـەنیا چینی سەرمـایەداره کە لەهـەر دوو حاڵەتەکەدا سودیان پێ ئەگات وە بەهۆی شەڕەکەوە گێژاوی ئابوریِ خۆیان چارەسەر ئەکەن و گیرفانی خۆیان بەرامبەر بەخوێنی ملیۆنە هاکریکار پڕئەکەن.

**لینین لەبارەی جەنگە ئیمپریالیستیەکانەوە وتویە:**

«لـەو جۆرە جەنگـانـە هیچ جۆرە ئەنجـامێك نابێت مەگەر شورش مەگەر جەنگی ناوخـۆیی مەگەر گۆڕینی ئەو شەڕەی کە بۆ سودی سەرمایە دارەکان و دابەش کردنی تالانی لە نێوان سەرمایەدارەکانا هەڵگیرساوە بەشەڕێکی ڕەوای زۆر لێ کراوەکان لەدژی زۆر دارانـەوەبکرێت بەتاقە جەنگێکی عادیلانەی قانونی وبیرۆز، بەبێ ئەو جۆرە شەڕە ناتوانریێ لەدیلێتی ئیمپریالیزم ڕزکاری بێت».

***«جـەنگی ناو خۆیی کەزەحمـەتکێشـەکـان لەدژی ئیمپـریـالیستـەکـان و چەوسێنەرەوان لەهەموو وڵاتە گەشەکردووکانا هەڵی ئەگیرسێنن بەرضبەرە ئەبێتـە جەنگێکی گەلی کەلەدژی ئیمپـریـالیـزمی جیهانی ئەوەستێ و یەك ئەگرێت. شۆڕش خۆی ئەم قسەیە ئەسەلمێنێ..***

***ئەم مەسەلەیە لەڕۆژ هەڵاتدا ڕوئەدات، ئێمە ئەزانین کە زۆربەی دانیشتوانی ڕۆژ هەڵاتـدا ڕائەپەڕن، جونکە بەسەدان ملیۆن کەس لەم ناوچەیەدا ئەو گەلانـەن کەسـەربـەخـۆ نین ومـافێ‌دراویـان نەدراوەتێ، وەلەژێربـاری جەوساندنەوەی سیاسی ئیمپریالیزمدان»***

***«ستالین»***

لەدوای جەنگی ١٤ـ١٩١٨ ڕوداوەکـانی ڕۆژ ڕاست قسـەکـانی لینینی یان سەلمانـد کەلەبارەی ئیمپریالیزمەوە کردبوی.

وەنیۆ نەتـەوەیی کۆمـۆنیستی تیۆری جەنگی ناوخـۆیی لینی‌نیان لەبـەرنـامەی خۆیانا بەشێوەیەکی دیالکتیکانە جێگیرکرد، جەنگی ناوخۆیی واڵە هەموو حزبەکان ئەکات کە بۆ گۆڕینی بارو دوخ و چۆنێتی نایاسایی یەوە خۆیان ئامادەبکەن.

تاقیکـردنەوەکانی حزبە سۆشیال دیموکراتەکان ئەوەدەر ئەخەن کە حزبی شۆڕشگێڕی چینی کریکار لەکاتی جەنگی ناوخۆییدا نەك تەنیا ناچار بەرهەڵستی هەمو ئەو ڕێکخراوە جۆر بە جۆرانە بوەستن کە سەرمایەدارەکانی بۆ خەڵەتاندنی کۆمەڵانی خەڵك دروستیان کردوە بەڵکـو پێویستـە دژی هەمـو ئەو سۆشیال دیموکراتانەی دەستە چەپ بوەستێ کەبەروکەشی گوایە خەمخۆریەوە لەڕابەڕینی شۆڕشگێڕانەدا خەریکی کاروکرداری دژ بە شۆڕشن ڕابوە ستێ و بەشێوەیەکی بێ بەزەییانە لێ یان بدات و بەهەموو جۆر ریسوایان بکات.

# بەشی چوارەم

● جەنگ.
● جەنگی عادیلانە.
● جەنگی ناعادیلانە.

## جەنگ

واتاڕاپەڕینی چەکدارانە لەنێوان وڵاتەکاندا یان لە نێوان چینەکاندا کەلە پێناوی چەند ئامانجێکی سیاسی و ئابوری دا ڕوئەدات. .
جەنگ دیاردەیەکی کۆمەلایەتی مێژوییە، واتاله قۆناغێکی تایبەتی مێژویی کۆمەلگای ئادەمیزادا دەست پێ ئەکات و پەیوەندی بەهەل و مەرجی ژیانی کۆمەلەوەیەو لە قۆناغێکی تری مێژووی کۆمەلدا تەواو ئەبێت. . لەڕوی مێژوییەوە پێویستی یەکەمین دەستەی چەکداری لە شکرا لەگەڵ پەیدابونی ملکداریێتی تاکەکەسی و پەیدابونی چینەکان و دەولەت پەیدابووە، لەو کاتەوە لەکۆمەلگای چینایەتیدا جەنگ بە شێوەی گشتی بوبەهۆی چەسپاندنی حوکمی چینە داگیرکارەکان وداگیرکردنی زەوی وزارو خەلك گرتنە ژێر دەست.
لە سەردەمی ئێستادا سەرچاوەی بنچینەی هەموو شەڕێك ڕێژیمی سەرمایەداری و ناکۆکیەکانێتی کەلەقۆناغی ئیمپریالیزمدا ئەگاتە ئەوپەری توندوتیژی خۆی. . تیۆری شۆڕشگێڕانە لە بارەی جەنگەوە ئەوە نیشان ئەدات کەدوجۆر جەنگ هەیە وەکو جەنگی عادیلانەو جەنگی ناعادیلانە. .

### ● جەنگی عادیلانە:

ئەو جەنگەیە کەلەبەر داگیرکردنی خاکي ئەموئەو وهێنانەژێردەستی خەلکەوە ڕونادات. . بەلکو جەنگێکی ئازادیخوازانەیەو لە پێناوی داکۆکی لە سەر نیشتمان و دەسکەوتەکانی چینی زەحمەتکێش لە دژی ئیستعمارو داگیرکاران، دەست درێژ کارانی بێگانە دژی کۆیلەیێتی و هەمو جۆرە ستەمیك بەرپا ئەبێت.

## جەنگی ناعادیلانە

نگێکی سنورشکێنە لەپێناوی ژێردەستەکردنی نەتەوەکانی ترو سەرکوتکردنی
ەتکێشان و فراوانبونی دەسەڵاتی داگیرکارانەدا بەرپا ئەبێت. بۆ نمونەوەکو جەنگی
ام، کەلەلایەکەوە هێزی ئیمپریالیستە ئەمەریکاییەکان و نۆکەرودار دەستەکانیان و
یەکی تریشەوە خەلکی ڤیێتنام ڕوبەڕوی یەك ئەجەنگان..
جەنگەی ئەمەریکا هەڵیٚ ئەگیرساند جەنگێکی سنورشکێن و دیلێتی حوازبو ئەو
نگەش کە خەلکی ڤیێتنام ئەیانکرد جەنگێکی عادیلانەبو، لە پێناوی بەدەست هێنانی
ربە خۆیی و ئازادی و یەکێتی گەل بو. ئەوەبو لەئەنجامدا ئەو جەنگە بووبە
نگێکی ڕەوای تەواوی خەلکەکانی هیندوچین.
ەر ئەوەیە هەرکەسێکی بەشەرەف و نیشتمان پەروەر بەر پەرچی هەوودەست
ێرییەکی ئەمەریکا ئەداتەوە کە ئەیەوی ڕێژیمی ئیستعماری ئازادی کوژی خۆی
قامگیر بکات.. تیۆری شۆرشگێرانە بەر هەڵستی هەو جۆرە جەنگێکی ناعادیلانەو
ست درێژکارانە ئەوەستیٚ و داکۆکی لەسەر جەنگی عادیلانەی کۆمەڵانی خەلك
ات.
یك لە جۆرەکانی جەنگی عادیلانە جەنگی پارتیزانی خەلکە، کە بریتی یە لە جەنگی
ند دەستە چەکدارێکی ناریك و پێکی خەلك لە پشتی بەرەکەی دوژمنەوە، لە
راستی ئەو ناوچانەی کە داگیر کراوون.. جەنگێکە کۆمەڵانی جەلك بە چەندان
ر بەرامبەرەدوژمن ئەینوێنن. وەکو جەنگی پارتیزانی خەلکی ئەسپانیا دژی
ەنسەییە داگیرکارەکان لە سەر دەمی ناپلیۆن دا، زیاتر لە سەدە و نیوێك لە مەوبەر.
نگی خەلکی ڕوسیە لە سەردەمی پەلامارەکەی ناپلیۆن دا هەر لە هەمان کاتدا..
نگی نیشتمان پەروەرە ئیتالیا ییەکان بە سەر کردەی «کاریبالدی» زیاتر لە ۱۲۰ ساڵ
مەوبەر. جەنگی فەرەنسەییەکان لە دژی ئەلەمانی یە داگیرکارەکان نزیکەی سەدێك
مەوبەر کە بە شێوەیەك لە شێوەکانی جەنگی پارتیزانی ناو ئەبرێت.
ر وەکو جەنگی دەستە و کۆمەڵە چەکدارە پارتیزانەکانی روسیە لە کاتی جەنگی ناو
ژیی و دوەمین جەنگی جیهانی دا.. هەر وەها لە ماوەی دوەمین جەنگی جیهانیدا لە
رەنسە و ئیتالیا و یوکسلافیا و پۆلەندەو بلگاریاو چیکۆسلۆفاکیا و یۆنان و چین و کۆریا
یێتنام و فلیبین و چەندان شوێنی تری بەمجورە رویان داوە.
ستاش بەرەی نیشتمانی ئازادیبەخشی ڤیێتنامی خوار و شان بەشانی دەستە لە شکری
کانی سپا سود لە جەنگی پاریزانیانە وەرئەگرێت.

لەم باسەدا مەفهومی مەسەلەی جەنك مەبەستێكی تری تیایە ئەویش شەڕ كردنە لە پێناوی ئاشتی داو ڕێگرتن لە شەڕی دەست درێژ كارانەی ئیمپریالیستی. ئەوەمان وت كە سەر چاوەی بنچینەیی جەنگ سیتەمی سەرمایە داری یە، ئەمەش مانای ئەوە نیە تاكو ئەوكاتەی سۆشیالیزم لە هەمو وڵاتەكانا ئەچەسپێ تونای بەر گریكردن لە جەنگ نابێت و ئیتر لە بەردەم هەلۆیستێكی دڕندەی جیهانیدا دەستە پاچەدابنیشین . . ئێستا ئەوەندە هێزی سیاسی و كۆمەڵایەتی نیشتمانی لە ئارادایە كە توانای ئەوەیان هەیە بتوانێ ڕێگای جەنگی ئیمپریالیستیانە لەبەرەی ئیمپریالیزم بگرن. ئەو هێزانەی ئەتوانن ئادەمیزاد لە مەترسی جەنگێكی جیهانی تازە ڕزگاركەن سێ هێزی گەورەی كۆمەڵایەتن وەكو : سیستەمی سۆشیالیستی جیهان ، ڕاپەڕینی نیشتمانیانەی دژبە ئیمپریالیزم، ڕاپەڕینی شۆڕشگێڕانەی كرێكاران لەوڵاتە سەرمادارییەكانا . .

## سوپاسێکی ئەدەب دۆستانە..

زۆر سوپاسی بەڕێزکاك محمد حاجی محمود دەکەین کەئەرکی چاپی ئەم کتێبەی گرتە ئەستۆی، کەتــاقـە کەسێك بوو وەفاداری ئەدەب و دوستی نیشان دا، ئەم کتێبەی لە مەرگی مەسوەدەیی ڕزگارکرد، هیواداریبن سەرکەوتووبێت.

ئاگر برهان قانع

## نیوسەدە تەمەنی

## برهان قانع

- (بورهان قانع)ی نووسەرو ڕۆژنامەنوس یەکێکە لە کوڕەکانی قانعی شاعیری چەوساوەکانی کوردستان.
- لە ساڵی ١٩٣٥ لە بناری شارەزور لە دێی «نەوێ» لە دایك بووە.
- لەحوجرەدا لە ژێردەستی باوکیدافێری خوێندن بووە وزمانی فارسی وعەرەبی بە باشی زانیوە.
- تەمەنی دە سال بووە ١٩٤٥ پاش کارەساتی مەهاباد لەگەل باوکیدا دەگەرێتەوە شارەزوور.
- لە ڕۆژنامەی دەنگی کورد. پێشکەوتن، نووسەربووە، سالی ١٩٥٩ لە ئیسگەی کوردی بەغدا کاری کردووە.
- ئەم نووسەرە چەند جارێك دەربەدەر بوە وزیندانی کراوە وەك ساڵانی ١٩٦٣، ١٩٧٤، ١٩٧٩.
- کۆمەلێك کتێبی چاپکردووە ونزیکەی ١٨ کتێبی دەست خەتی لە پاش بەجێ ماوە.
- ڕۆژی ١٩٨٥/٦/٢٧ بە کارەساتی دلتەزێن کۆچی دوای کردووە وتەرمەکەی لە گۆڕستانی بێرکۆت لە هەولێر نێژراوە.

چاپی یەکەم ١٩٩٣

چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین

ترجمة: برهان قانع